# لەبیرەوەرییەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب و هاوڕێکانیدا

فەردیدون عەبدولقادر

چاپی یەکەم - ٢٠١١

- ناوی کتێب: لەبیرەوەرییەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب و هاوڕێکانیدا
- نووسەر: فەریدون عەبدولقادر
- تیراژ: (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپی یەکەم
- چاپ: چاپخانەی شەهید (ئازاد هەورامی)
- لەبڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ

## پێشەکی

ئەم چەپکە یادو بیرەوەرییە بەسەرکردنەوەی رۆژانی دێرینی خەباتە لەقۆناغی موقاوەمەتی زیندان و دەورانی (کەم ژیان و کەڵ ژیان)، دەورانێك کە خاڵە شیهاب و هاورێکانی، خاڵەو خوێندکارەکانی خوێندنگەی کۆمەڵەو یەکێتیان ئاوەدانکردبووەوەو لەکۆڕی نەبەردی راستەقینەدا گیانبازیان بۆ رزگاری کوردستان دەکرد.

کاتی خۆی، رێك لەساڵی (١٩٩٤)دا، هەڤاڵ فەریدون عەبدولقادر ئەم زنجیرە بیرەوەرییانەی لەکوردستانی نوێ لە ژمارەکانی (٨٤٢، ٨٤٣، ٨٤٤، ٨٤٥، ٨٤٦، ٨٤٨، ٨٤٩، ٨٥٠، ٨٥١، ٨٥٤، ٨٥٥، ٨٦٠، ٨٦١، ٨٦٣، ٨٦٤) بڵاوکردەوە کەبەشێکی بەرچاوی تێکۆشانی سێکوچکەی کۆمەڵەو هەڤاڵانی زیندانی بۆ نەوەی نوێ تۆمارکردبوو،

کوردستانی نویّ بەسوپاسەوە دوای روخسەت وەرگرتنی لەنووسەری باسەکە، پێی باش بوو ئەم بیرەوەرییانە بکاتە دیاریی بۆ نەوەی نویّ و تێکۆشەرانی کەتازە رێی خەباتی دوورودرێژ دەگرنەبەر.

ئەم وێستگە گرنگەی خەباتی دێرین دەتوانیّ ئیلهام بێت بۆ نەوەی نویّ و رێزلێنانێکی شایان و خنجیلانەش بێت بۆ رۆحی بەرزەفڕی خاڵە شیهاب و هاوڕیّ شەهیدەکانی.

**کوردستانی نویّ**

**حوزەیرانی ٢٠١١**

سەرۆكی دادگای بەعسیان (دادگای شۆڕش) ترس ناخی بەجێنەهێشت بەگوێرەی ئەو ئامۆژگاریانەش كە لە (ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش ئەنجومەنی سەلامەتی نیشتمانییەوە بۆی هاتبورن ئەبو حوكمی شەهیدانی نەمر كاكە شیهابو جەعفەر عەبدلواحیدو ئەنوەرزۆراب لە سێدارەدان بێ، پاش ئەوەی توانای خۆی كۆكردەوە دوسێجار كۆكیو مڕاندی بڕیارەكەی بەناوی دادگاوە خوێندەوە ئەو سێ هاوڕێیە بەحوكمی لە سێدارەدان،و ٨كەس ئازادكردن، و ١٨كەسیش بەشەش ساڵ زیندانی ئەو سەری نەوی كردو كاكە شیهابو هاوڕێكانمان سەریان بڵندكردو بەژیانو سەركەوتنی گەلەكەمان پێشوازی مەرگیان كرد. بەرلەوەی بڕیاری دادگا لەسەرخۆمان ببیستین، گەلێ دەستەوگروپی ترمان دی لەوانەی بەمردن حوكمدرابوون گەلێكمان دی ئەژنۆی شكابوو هەندێكی تر ماتومەلول بوون، هەندێكیش ئازا، بەلاَم ئەو دادگاو ژێرزەمینە هەرگیز قارەمانی وەك ئەو سێ هاوڕێیەی بەخۆوە نەدیبوو.

خاڵەشیهاب هێمنو لەسەرخۆ هەمومانی خڕكردەوە، وەك سەركردەیەكی گەورەو بە تەجروبە قسەی بۆكردین لەسەریەك زیاتر لە ١٥ دەقیقە قسەی بۆكردین لەسەر ئەركەكانمانو ژیانی زیندانو، خۆپاراستنو یەك پاراستنو

سووربوون لەسەر خەبات‌و ڕێبازەکەمان. کەمجار گوێم لە خاڵەشیهاب بوبو وەکو ئەوجارە زنجیرەیی ڕەوان، بەپێزوخۆش باسی خورت‌و دڵنیا قسەمان بۆبکا. هەرگیز لە دیمەنی بەردەمی مەرگ‌و ڕووبەڕبونەوەی پەت‌و سێدارە نەدەچوو. کەسێ باش تیێ بڕوانیایە هەستی نەئەکرد مێش میوانی بێ، یاخود بیری لای مردن بێ.. بۆ ژیان قسەی ئەکردو بۆ خەبات‌و کۆڵنەدان، دڵپڕلەهیوا چاو لە سەرکەوتن ئەدواو ئەجولا، تا ئەو ساتەی لەیەکتریان جیاکردینەوە ئەوان بۆ ژوورەکانی بەشی سێدارە، ئێمەش بۆ قاوشەکانی زیندان هەمووشتێکی کۆنترۆڵ ئەکرد، بەوی ئەوت ئاگات لەوبێت بەمنیشی ئەوت دڵی ئەوانی تر رابگری تەنانەت لەو کاتەدا شەهید جەعفەر لە کاکە حەمە زویربوو، دەنگی لێ بلندکردەوە خاڵەشیهاب بە هێمنی پێی وت: هاوڕێ تازە بیرت لای هاوڕێکانت بێ زیان لەنیوەش بگەڕێتەوە باشە.. تکایە ناڕەحەتی مەکە. کاتی جیاکردنەوە ئارام‌و لەسەرخۆ یەکە یەکە دەستی هەموومانی گوشی، واقسەی لەگەڵ ئەکردین ئەت وت فەرماندەیەکی بەجەرگ پێشمەرگەکانی بۆ نەبەردێکی شۆڕشگێڕانە ئەنێرێ‌و خۆشی چاودێری جێبەجێکردن ئەکا. چەندە گەورەو مەزن بوو، چەند

بیرباوەڕی خۆی لاگەورەو مەزن بوو. چەندە بە گەورەیی و مەزنی جێیهێشتین با هەرئەوەندەش گەورەو نەمریمێنیتەوە.

هاوڕێکانمان داوایانکرد بەر لە سێدارەدان چاویان پێیان بکەوێ و دواین قسەیان لەگەڵ بکەن.. هەموو زۆریان وت و سیخورەکان کەمیان بیست، ئەو رۆژە شەهیدان خاڵەشیهاب و جەعفەر عەبدلواحید، ئەنوەر زۆراب لە سێدارەدران هاوڕێ دارۆو من پێمان داگرت وازمان نەهێنا تا مۆڵەتیان داین بچینەلایان. ئێوارەبوو پێمان نایە ژوورەکانی سێدارە، لەهەموویاندا لە راڕەو بنمیچ و زەمینەکەشدا مەرگ پڕ بەزیندان لە رووی ژیاندا هاواری ئەکرد هەمووشتێ ساردوسڕو بۆنی خاکی لێ ئەهات زایەڵەی سرودی ئەو کەڵە پیاوانە تەپڵی ئاهەنگی (ئازادی خواین کوردین ئێمە) دڕی بەدیلی و ژێردەستی ئەدا، ئەو دەنگە دلێرەی ئەوان چرای تاریکستانی زیندان بوو، تاگەیشتینە لایان دەنگی سرودیان کزنەبوو سڵاومان لێکردن و توند بە کەلەپچەو زنجیرەوە بەدەستی پۆلاین، یەکەیەکە دەستیان گوشین چەند ساتێ بەرلەگەیشتنی ئێمە زەماوەند تەواوبوبوو کەس وکار بلاوەیان لێکردبوو، چونکە خاڵەشیهاب داوای کردبوو کە کەس بۆیان نەگری، بەڵکە هەڵپەرکێ بکەن و روخۆش بن بوارنەدەن دوژمن هەست

بەسەرکەوتن بکاو پەژارەش ورەی کەس‌وکاری هەڤاڵانمان بنەوێنێ، زۆری نەبرد لەو خۆشەویستی‌و سام‌و دڵەڕاوکێیەی ئەو چاوپێکەوتنە شایستەیەدا، مفەوەزە ئەمنەکەی یاوەرمان شەرم دایگرت‌و وتی ببەخشن من بەجێتان دێڵم، ئازادبن. بەلامانەوە سەیربوو، بەڵام بەجێیهێشتین لەو چەند دەقیقەیەدا، هاوڕێ جەعفەر نوکتەیەکی خۆشی گێڕایەوە هاوڕێ ئەنوەر دەریایەك دڵسۆزی باڵایەکی بەرزی ورەی نیشاندایین لەوەش زیاتر خاڵەشیهاب زنجیرەیەك ئامۆژگاری بەنرخ‌و رەوانی کردین. وتی من ئاسودەم بە شەهیدبونم دەستی براکانم لەو شاخانە ئاواڵەترئەکەم رێکخستنەکانمان زیاتر ترسیان ئەشکێ، چونکە ئەوان تا ئێستا لەترسی ئەوەی ئێمە لە سێدارەنەدەن لەگەڵێ چالاکی خۆیان پاراستووە ئامانەتی هەموو هاوڕێیان‌و ئەم رێبازە. تکام وایە نرخی یەکێتی خۆتان‌و براتان‌و قەدری مام جەلال بزانن، زۆربەمان ئازادین لە شارو لەشاخ کارئەکەین، ئێوەش ئازادئەبن بیرتان نەچێ کە ئەم دوژمنە بەزەبروزەنگی شۆڕشگێڕانە لەناو ئەچێ، چیتان پێئەکرێ بۆ پەرسەندنی خەباتی چەکدارانە درێغی مەکەن قسەوباسی خۆش‌و لەمەڕ پەیوەندی برایانەو شەخسی زۆریشی لەگەڵ هاوڕێ

دارۆو من کرد. دواقسەش پێیوتین: بۆ ئەوەی کەڵ بژین کەم ئەژین.

هێشتا زۆر بەسەر شکستی ١٩٧٥دا تێپەری نەکردبوو ئازارو ئایندەی نادیاری لەگەڵ ئازارو ئایندەی تاریكو پڕ مەترسی زیندانا تێکەڵ بوبو، زیندانی سەقز قەرەباڵغ بوو تەنها لە راڕەوەکەی دەرەوە جێگەی ئێمە هەبوو. سەرەوەی ئێمە لە هاوڕێیان عومەری سەید عەلی، عەلی بچکۆڵو من لەگەڵ شەهیدان خاڵە شیهابو جەعفەربووین کابرایەکی (گەردن کوڵفەت). لە ژووری تایبەتو هەڵسوکەوتی لەگەڵ زیندانیەکانو هی ئەوانیش لەگەڵ ئەو لە سەرۆکی زیندانیەکان ئەچوو، تەنانەت پاسەوانەکانیش لەبەر سڵکردنەوە رەفتارێکی تایبەتیان لەگەڵ ئەکرد ناوی (عەباس قوچانی بوو) گەرچی تلیاکی ئەکێشاو، هیزۆین، جەستەو بازوی بەهێزیان پوکاندبوەوە، بەڵام هێشتا هێزو توانای زۆری مابوو، رۆژێك لەبەرچاوی خۆمان بەئاسانی کەلەپچەی هەردوو مەچەکی بەئاسانی بچڕاند. هەرلەیەکەم رۆژەوە بەپیرمانەوەهاتو لە ژوری خۆی لە جێگای باشی زیندان جێگەی بۆ زۆربەمان کردەوە- لەناو زیندانەدا میوانداری باشی لێکردین. لە یەکەمین قسەوباسدا کەوتە ژێر تەئسیری قسەو کەسایەتی خاڵە شیهابو باسی خۆی

بۆکردین که ماوەیەکی زۆریش لە تاریکی زینـدانی (قـزل قلمەو) زیندانی تریش بـوە. لەگـەڵ هـاورێ زینـدان بـوە ئەودەمە لەسەر دزی گیرابوو کە پرسیارمان لێکـرد بۆچـی دزی کردوە؟ لـە وەڵامـدا وتـی: ئەشـێ تـامردن تەماشـای تەلاری خۆاپیێـداوان بکـەمو بڵـێم ماشـاالله. ئـەم کابرایـە لەزیندانیشدا حەبی تایبەتی (مخـدرات)ی ئـەخواردو خاڵـە شیهاب هەمیشە ئامۆژگاری (عەباسی) ئەکرد کـە دەسـت لە کێـشانی ئـەو شـتەخراپانە هـەڵبگرێ: کـارێکی زۆری کردبوە سەری تا لەهەفتەی سێیەمی ئاشنایەتیدا بـەجۆرێ کـاری تێکـرد کەدەسـتی لـە (مخـدرات) هـەڵگرتو وازی لێهێناو تانزیك گوێزانەوەمان ئەو حاڵە درێژەی کێشا.

- چەندجارێك سەرۆکی زینـدان لێکۆڵینـەوەی لەگـەڵ کـردین هـەمووجارێ ئـەوەمان دوپـات ئـەکردەوە کـە ئێمەش پێشمەرگەبووینو رژێمـی عـیراق ئەیـەوێ بمـان گرێت چـونکە گوشـاری دەسـت پێکردۆتـەوە، ئـەویش بەردەوامەندی وەڵامی نەئەدایەوە لـە زینـدانی سـەقزەوە چەندجارێك سـکاڵامان بـەرزکردەوە بـۆ دەسـەڵاتدارانی ئێران کە تەسیلم بەڕژێمی عیراقمـان نەکەنـەوە چـەندە بـۆمان باسکردن کەئەو رژێمە دڕندەیـــەو مـەترسی ئەوەهەیە بمانکـــوژێ، هیچ گوێیان لێنەگرتین.

سەرۆکی زیندان هەموومانی دابوو بەدادگا تا بـەتاوانی بەزاندنی سنور بەدزیەوە دادگایمان بکات.

ئەوکاتە حەوت هاورِێ بووین (شەهیدان خالـە شـیهاب، جەعفـەر عەبدولواحیـد، عومـەری سـەید عـەلی، عـەلی بچکۆل، ئەرسەلان بایز، ئاوات عەبدولغەفورو من) دەسـت بەکەلەپچەو لە ژووری دادگادا بـە حاکمەکـەیان ناسـاندین سەرەتا لێمـان ووردبـوەوەو یەکەیەکـە پرسـیاری لێکـردین لەوەلآمـەکانمان لـەوەحالّی بـوو کـە ئێمـە دەسـتەیەك تێکۆشـەری کـوردین، ئـیتر پاسـەوانەکانی لـە ژوورەکـەی کردەدەرەوەو رووی تێکردین: منیش کوردم خەڵکی مهابـادم باسی خۆتانم بۆبکەن. شەهید شیهاب وەلآمی دایەوە: ئێمـە پێشمەرگەبووین چەند مانگێکە وەکو ئەزانی شۆڕشەکەمان فەوتاو بەودەردەچوو کە ئەیبینی، ئێمەش ناچـار گەڕاینـەوە شارەکانی خۆمان بۆ عـیراق دیـارە نـەتان تـوانی لـەئێران بحەوێنەوە؟

-نەخێر رژێمـی بـەعس ویـستی بمـانگرێ، ئێمـەش لـە دەستیان هـەلآتوین بـۆ ئێـرە، گەرئـەکرێ رێگـەمان بـدەن دەربازبین بچینە دەرەوەی ئێران بۆ ولآتێکـی تـر یـاخود بـە پەنابەر قبولّمان بکەن.

-لەوەئەچێ سووربن لەسەر تەسلیم کردنەوەتان.

-ئەتوانی چیمان بۆبکەی؟

-ئێمەش وەك ئێوە دەردەدارین ئەو ناخۆشیەی ئێوە هی هەموومانە، ناتوانم هیچتان بۆبکەم.

-چارەچییە، خۆت ئەزانی لەوێ لەسێدارەمان ئەدەن.

-من ئەتوانم لە (١١) رۆژ تا یەك ساڵ حوکمتان بدەم، چەندە بۆ ئێوەباشە، ئەوەندەتان حوکم ئەدەم.

-لەناوخۆماندا کەوتینە قسەوباسو لێکۆڵینەوە، بۆئەوەی هەم دەرفەتی تەقەلای ترمان بمێنێ کە بەپەنابەر قبوڵمان بکەن، هەم ئەگەرنەکرا لە کاتێکی وەهادا تەسلیمی عیراقمان بکەنەوە کەئەو شۆڕشەی بەدەستەوەبوو، واکڵپەی نەسێنێ کە هەلومەرجی سزادانمان (لەوێ) سەخت بکات.

بۆیە رێکەوتین لەسەرئەوەی (٤) مانگمان حوکم بدات ئەویش بەقسەی کردین، بەڵام هەرتەسلیممان ئەکەنەوە.

پاش هەوڵێکی زۆر، لەسکاڵاو نامەنووسین بۆ هەموودەسەڵاتو دەزگا تایبەتیەکانی ئێران لە دەربازبوون نائومێدبووین رۆژی ٢١/١٢/١٩٧٥ لە سنەوە بەرەو مەریوان راپێچیان کردین لەوێ لەسەربازگەیەکدا زیندانێکی تایبەتیان پێبەخشین، ئەفسەرێکی پایەبەرزو پاشان ئەفسەرێکی لاو هاتن قسەیان بۆکردین، ئیتر بە

تـەواوی دڵنیـابووین کـە تەسـلیم بـە رژێمـی عیراقمـان ئەکەنەوە، ئەو ئێـوارەو شـەوە شـەهیدان (خاڵـە شـیهاب‌و جەعفەر عەبدولواحید،و هاوڕێیان عومەری سەید عـەلی‌و، عەلی بچکۆل، ئەرسەلان بایز، ئاوات عەبدولغـەفورو مـن) پێکـەوە روو لـە چارەنوسـێکی رەش بـووین دەمارەکانمـان گرژبووبوون. بەپەلـە بـەناو زینـدانی خاڵیـدا هاتوچـۆمان ئەکرد. جاروبار ئەوەستاین خرپەبوینـەوەو قـسەمان ئـەکرد خاڵە شیهاب لە هەمووومان هێمن تربوو ئـارامتر خـەریکی بیرکردنەوەبوو ئێمە دووبەدوو یان زیاتر خەریکی تەگبیربوین لەناکاویش لەیەکتر نارەحـەت ئـەبووین. ئـای کەشـەوێکی ناخۆش بوو بیرمان لەسەر هـیچ وشـەو رسـتەو نەخـشەیەك راگیرنەئـەبوو. شـەو درەنـگ خاڵـە شـیهاب هـەموومانی کـــۆکردەوە، وامئـــەزانی مەفرەزەیـــەك پێـــشمەرگەی گەمارۆدراوین ئەمانەویٚ باشترین رێگـا بۆمـەرگی خۆمـان هەڵبژێرین خۆکوژی یا بەرەنگابوونـەوە، تـا خاڵـە شـیهاب وتی: ئێمە ئەم رێگەمان هەڵبژارد بەنیازی ئـەوەی بگەینـە هاوڕێکانمان لە دەرەوە. هەم پەلەبکـەین لـە هەڵگیرسـانەوە شۆڕشدا هەم کۆمـەڵەو هاوڕێکانمان بپارێزین.

یەکێك قسەکانی پێبڕی‌و وتـی: خـەتای ئـەو قاچاخـچیە سەگ بابەبوو.

-وەختی ئەوەنیە چۆن ئەرکەکانمان تەواوبکەین.

-با نەخشەکەمان جێبەجێ بکەین، لە سەقز وتمان رائەکەین.

-گەر توانیمان رائەکەین نەشمان توانی ئەبێ بزانین کەئەو برایانەی گیراون چارەنوسیان هی کۆمەڵەش زیاتر بەدەستی ئێمەیە.

-گەر رابکەین.

قسەی من بۆ ئەو حاڵەتەیە نەتوانین.

-ئەی چی بکەین خاڵە شیهاب وەك فەرماندەیەکی مەفرەزەکەمان فەرماندەیەکی کارامەو ئازاو دڵسۆز زۆر بەهێمنی قسەکانی تەواکرد.

-ئەگەر (اعتراف) کرابو رەنگە هەندێ لەوانە قسەی درکاندبێ ئەبێ ئێمە ئازاو ژێر دیفاع لە بیروباوەڕی خۆمان بکەین نهێنیەکان بپارێزین.

-یەکێك وتی هەرئەبێ رابکەین.

-هەوڵبدەن بەهەموو تواناتانەوە باسی (ئابونە)و (کۆبونەوە) بەدرۆبخەنەوە، وادەربخەن تەنها ئەوەی ئێمە یەك (تیار)ی فیکری بووە، رێکخستن نەبووە (مەسەلەی رێکخستن مەسەلمێنن، چونکە ئەوە راتان ئەکێشێ بۆ پرسیاری ترسناكو بێکۆتایی، گەر قسەکرابوو ئێوە

مەسئولیەت هەڵبگرن منیش مەسئولیەتی هەمووتان ئەگرمەئەستۆ. بەڵام نهێنیەکانی ڕێکخستن مەدرکێنن. بەوشێوەیە درێژەی دا بەقسەکانی تا دڵی قایمترکردینو دەماری خاوکردینەوە، شەهید جەعفەریش دەمبەخەندەو دڵپڕ لەوره نوکتەیەکی بەسەرداهێنا تەمو تاریکی بەردەممان رەویەوە. هەندێ وێنەم کێشابوو بەدیاری دام بە ئەفسەرێکی لاو کەچەندجارێ هاودەردی نیشاندایین.

لەئەمنی سلێمانی بەچاوی بەستراوەوە، بەناو دەنگەدەنگی دەرگای ئاسنو هاتوچۆی بێسەروبەری خۆنوانەدنی ئەمنەکانو شیرەشیری بێجێی پاسەوانەکاندا (شەهید شیهابو هاوڕێیان عومەری سەیدعەلیو عەلی بچکۆلو من) لە ژوورێکی ساردو بێ ڕایەخ فڕێیان داین بەدەنگێکی خۆشو ئاشنا هاوڕێیەکی گیراو. بە ئاهەنگێکی خۆش گۆرانی ئاسا چەند رستەیەکی بەگوێماندداو وتی: (شیرین بەهارە بەهاری شادان... قسەمان نەکردوە بەقامچی لێدان، لە پرسیاری ئەو دڵت نەترسێ.. هیچ کەسێ لەم ناوە ئێوە ناناسێ) خاڵە شیهاب وتی: ئەوە (عەلی)یە. زیاتر لە دووسەعات بەو جۆرەماینەوە، لەو دەرفەتەدا کە زانیمان کەس لەدەورمان نیە کاتی نان خواردنی ئێوارەبوو کاك شیهاب وتی: لە هەرجێگەیەك بانگیان کردن بڵێن

ئەمانەوێ لەگەڵ بەڕێوەبەری ئەمن قسەبکەین، واباشترە، لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو (لە ئێستاوە بیری خۆتان کۆبکەنەوە هەوڵبدەن کاربکەنە سەر بەڕێوەبەری ئەمن و گوێ گرەکانتان). گەر گوێمان لێبگرن. وەکو ئەوسا پێم وتن لەبیروباوەڕی خۆتان لە بۆچونەکانتان بەرگری بکەن ئێستا شارەکە هەمووی زانیویانە ئێمە لێرەین.

زۆرکەس بۆمان تێئەکەون لە پێنجوێن باش کارمان کرد. کە بانگیان کردین بۆ پرسیار سوربین لەسەرئەوەی قسە بۆ بەڕێوەبەری ئەمن بکەین. پاش هاتوچۆی ئەفسەرەکانو ئەمسەروئەوسەرکردن بەچاوی بەستراوەوە بۆ شوێنێکی تر کێشیانکردین وتیان بۆلای بەڕێوەبەرئەچین یەکێك لە کۆتایی ژوورەکەدا بەدەنگێکی لە خۆڕازی قسەی لەگەڵ کردین یەکێکمان پێمان ووت: ئێمە میوانی تۆین ئاخۆ تۆ بەم جۆرە پێشوازی لە میوان ئەکەی پاش ئەو قسەیە چاویان کردینەوە، ژورەکە هەشت کەس پاکو خاوێنی رەنگ لێپرساوی لێدانیشتبوو. بەڕێوەبەر فەرموی لێکردینو ئێمەش لەسەر کورسی و شوێنە خاڵیەکان دانیشتین.

تێکڕا بەجۆرێ قسەمانکرد شەهید شیهاب ئەوەنە سەرکەوتوو رێبەری قسەکانی کردینو هەمووی پێکەوە

گرێدایەوە کە ئەتوانم بڵێم یەکێك بوو لە جوانترین دیفاعی تێکۆشەرەکان لە رووی رژێمدا قسەکان کاریگەرو رۆشنبوو بەرنامەیەك بوو بۆ چارەسەری ئەو دەلاقە گەورەیەی کە لەنێوان کوردو عەرەبدا. یەکێك لە دانیشتوان حاکم (تحقیقێکی) کوردبوو کە بۆ گەلێ کەسی گێڕابۆوە لەوانەی ئەم دیمەنەی بۆ باس کردبون کاك (شازاد صائیب) بوو، ئەوانی تریش لێپرسراوانی حزبی بەعسو (بەرەی نیشتمانیو نەتەوەی) بوون ئەو دیفاعو قسانە بە درێژایی مانەوە لە سلێمانی رێزی زیاترکردین.

لەسەرداوای ئەمنی عامە پەل بەستیان کردین بەرەو بەغدا، لەدوو ئوتۆمبیلدا دابەشیان کردین، چەند ئۆتۆمبێلی پاسەوانیشیان لەگەڵ ناردین لە رێگە خاڵە شیهابو کاك جەعفەر کەوتبوونە ئۆتۆمێلی لێپرساوی قافڵەکەمان کە ئەفسەرێکی لاوبوو ناوی (نقیب کەریم)بوو، ئێمەش لەپشتی پیکاپێکدابووین، جێگەمان زۆر سەغڵەتو ناخۆش بوو واپێ‌ئەچوو قسەوباسیان لەگەڵ نەقیب کەریم دامەزراندبێ لەوەش دڵنیابووم کە قسەی لەگەڵ بکەن کارێکی ئەوتۆئەکەن گەلێ بیری چەوتی راستبکەنەوە، بەڵام دەرکەوت زۆرلەوە زیاتر کاریان تێکردبوو.

له (دوز) لایاندا بۆنان خواردنی نیـوەڕۆ، درەنـگ ئێمـه لەسەر مێزێکی گەورە پێکەوە دانیشتین نەقیب کەریم هاتە لامان وتـی: کەلەپـچەکانی دەسـتتان ئەکەمـەوە نـانێکی باشتان ئەدەمێ، بەڵام تکایە رامەکەن‌و نان بـڕاوم مەکـەن. دڵنیابە ناتوانین لەناو ئەو هەموو پاسەوانەدا رابکـەین لـە قسەکانی بەردەوامبوو وتی: زۆربـەداخم کـە ئازادکردنتـان بەدەست من نیە، شەهید جەعفەر وەڵامی دایـەوە، خۆزگـە بەدەستی تۆ بوایە نەقیب کەریم درێژەی دایـە بـەدەنگێکی نـزمتر لـەجاران وتـی: مـن ئـەتوانم خزمـەتێکتان بکـەم، کارێکی وائەکەم نیوەشەو بگەینە بەغدا، لـەوێ ئەفـسەری خەفەری سەرخۆشی بێتاقەتە ئەمڕۆ پێنجشەممەیە.

-سودی چیە؟

-لای کەمی ئـەمڕۆ لـە رێگـەوە پرسـیارتان لێناکـەن‌و ئەشکەنجە نادرێن، سبەینێش هەینیە کەسـی والـەوێ نیـە بۆخۆتان پشوئەدەن.

-سوپاست ئەکەین، بیرمان ناچێتەوە.

-دووبارە تکا ئەکەم بیر لە راکـردن مەکەنـەوە، چـونکە ناچارئەبم لەبری خزمەتتان واجبی کارەکەم جێبەجێ بکەم.

-نیوەشەو گەیشتینە ئەوێ ئەفسەری خەفەر کەخـەوتبوو خەبەریان کردەوە بە بۆڵەبۆڵ بێ ووردبوونەوە رەوانەی کردین

بۆ (الموقف العام)و لەوێ تێکەڵ هەموو گیراوەکانیان کردین سەرفرازبێت نەقیب کەریم چەندە خزمەتێکی گەورەی کردین لەوێ تێکەڵ هاورێ گیراوەکانمان بوین، دەرفەتێکی زێرین‌و گەورەمان دەستکەوت، ئەوشەوەو هەموو رۆژی هەینی، ٣ سەعات خەریکی تێگەیشتن بووین لە ئیفادەکان‌و وەزعەکە، لەو ماوەیەدا نەخشەمان دانا چی بڵێین، چۆن ئیفادەی ئەوانی تریش راست بکەینەوە، بەداخەوە ئەو شەوە تێگەیشتین ئەو دوو ئەندامەی مەکتەبی سیاسی (الحرکە الاشتراکیە العربیە) کە گیرابوون‌و بەڵگەیان پێگیرابوو دۆستی رێکخراوەکەمان بوون، قسەیان لەسەر شەهیدان (خالە شیهاب‌و جەعفەر عەبدولواحید، ئەنوەر زۆراب) کردبوو کە گوایە لە سوریا چاویان پێیان کەوتووەو لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال‌و سەرکردەیەکی تری عەرەبی خالە شیهابیان دیوە، ئاگاداری سەفەری شەهید جەعفەر بوون بۆ سوریاو نامەشیان لەوێ بۆهێناون هەروەها بۆ شەهید (ئەنوەر)یش ئەوسا تێگەیشتم کە ئەو سێ هاورێیەی بە تۆمەتی گران کەوتونە خانەی سزادانی بەندەکانی (ئەمنی خارجی) تەگبیرمان لە هەموو ئیفادەکانمان کرد، بەڵام ئەو کەلێنە هەرمایەوە.

هۆڵی گشتیو ژوورەکانی (ئینفرادی) ئـەمنی عـام، ئـەو شـوێنەبوو کـە ئەنـدامو کـادرو ئەنـدامی سـەرکردایەتی زۆربـــەی حـــزبو رێکخـــراوە سیاســـیەکانی عیراقـــی تیاکۆکرابووە، لەوێ ئۆپۆزیسیۆنی راستەقینە باشـترئەبینرا رەنگە ئەو ختووتە کەموکورتـەی لـە ئیفـادەی گیراوەکـانی ئەوێدا هەبوو. تەماشـاکردنو لێوربوونـەوەیان بـۆ سـەرانی رژێـم مایـەی زەنگـی مەترسـی بووایـە، بۆنەیارەکانیـشی مایەی دڵخۆشی و ئومێدبوایـە، هەرلـە (عبداللـە علـوم السامرائی) کە ئەندامی سەرکردایەتی حزبی بـەعس بـوو تـا ئەگاتـە سـەرانی ناسیۆنالیـستی عـەرەبو لایەنـە ئاینیەکانو کۆمۆنیستو کوردو ئەفـسەرەگەورەکانی سـوپا هەموو لە ژێرباری دارکـاریو ئەشـکەنجەدا یـەك دەنگیـان ئەهات هاوار، هاوار لە دەستی ئازارو لـە رووی زۆرداریـدا. ژوری (انفـــرادی) ئێمـــەش لەتەنیـــشت ژوورەکـــانی هاورێکانمانەوەبوو. خاڵـە شـیهابو کـاك ئەرسـەلان بـایزو بەندە بۆ ماوەیەك لەیەك ژووردابووین پێکەوە ئەوماوەیە بـۆ هـەردوکمان قوتابخانەیـەك بـوو هـەم لەسەردەسـتی خاڵـە شیهابدا دەرسـی زمانمـان وەرگـرتو هـەم لـە سەردەسـتی بەعـــسدا چەندەرســـێکی مەشـــقی خـــۆڕاگرتنو بـــەعس ناسـینمان وەرگـرت. ئەگەرچـی جێگەکـەمان تەنگەبـەرو

ترسناك بوو. بەڕۆژ لە بەرچاوی یەکتری ئازاریان ئەدایین. شەوانەش لەخۆشی بەیەك گەیشتنەوە چاوپێکەوتنەوە بە هاوڕێکانمانو گوێگرتنمان لە بیرەوەریەکانی خالە شیهاب. تادرەنگ خەومان لێنەئەکەوت.

درەنگە شەوێك لاوێکی عەرەبی تێهەڵدراویان کرد بەژوورەکەماندا دیاربوو تا ماندوبون ئەشکەنجەدرابوو، ئەو لە ئێمە سڵی نەئەکردەوەو ئێمەش لەو چاوبڕکێی هەستو زنجیرەیەك پرسیار پردێکی لە نێوانماندا دروستکرد. بۆمان دەرکەوت کە میوانەکەمان کۆمۆنیستە، گۆڵچی تیپی هەڵبژاردەی تۆپی پێیە لە عیراقدا بەناوبانگو ناسراوە، حزبەکەی لە دەرەوەی زیندان هاوکاری حزبی بەعسە لەبەرەی سیاسی حوکمڕانی عیراقدا تێکۆشەرەکانیشی وەك ئەو میوانی ئەشکەنجەن بۆی باسکردین کەناچاریانکردوە دان بەوەدابنێ کەپاشی ساڵی ١٩٧٤و بەشداری حزبی شیوعی لە جەبهەی بەعسیاندا لەگەڵ (بەشار)و هاوڕێکانی تریاندا کاریپیانکردووە لەناو حزبی شیوعیدا.

خاڵە شیهاب راچڵەکی وتی: بەدبەخت. گەر ئەو ئیفادەیە وابمێنێتەوە ئەوا حوکمی سێدارە مسۆگەرئەکەیت.

-چارچیە؟

-ئیفادەکانتان بگۆڕن ئەوانەی لەگەڵ تۆهاتن لەم ژورانەی تەنیشت ئێمەدانران.
-بەڵێ ئەوانە هاوگرفتی منن ئەبێ ساڵی ١٩٧٤ بکەین بە ١٩٧٢ ئێمە وتومانە تەنها مانگی ئەیلول تا تشرینی دووەمی ١٩٧٤ پێکەوەبوین‌و کارمان کردووە بیکەین بە ١٩٧٢ ئەکاتە پێش مۆرکردنی بڕوانامەی جەبهەی بەعسیان ئەوسا بەیاسا ناتوانن جگە لە زیندانیکردن حوکمی ترتان بدەن. ئەو شەوە بە ئاهەنگی گۆرانی، بەلام بەزمانی کوردی بە هاوڕێیان (جەعفەرو، ئاوات عەبدولغەفور، عومەری سەید عەلی‌و عەلی بچکۆل‌و بە هاوڕیانی قاوشی گشتیمان وت قسەمان هەیە بۆئەو میوانە تازانەی کۆمۆنیستەکان، پێیان رابگەیەنین ئەو شەوەو رۆژی ئایندە گەلێ جار خاڵە شیهاب بەدەنگێکی ئاشنا بەمارشێ بە ئاهەنگێکی گۆرانی کوردی ئەیووت: هۆهۆ جافر بە میوانەکانتان بڵێن گەر بانگکران لە قسەکانیدا ساڵی ١٩٧٤ بکاتە ساڵی ٧٢... براکەم ئازیزەکەم... ئای ... ئای ساڵی ٧٢ باشەو ساڵی ٧٤ ئەیان کوژێ. لەوەلامیشدا کاک جەعفەر بەدەنگێکی بەسۆزو لێزان بە ئاهەنگی خۆش پرسیارەکانی ئەوانی ئەنارد لەولاشەوە هاوڕێ ئاوات یا عومەری سەیدعەلی بەو دەنگەیان کەخۆیان لایان وابوو

خۆشە هەماهەنگی پرسیارەو وەڵامیان ئەکرد بەگۆرانی لە ئەنجامدا خالە شیهاب بەگۆرانی ئیفادەی بۆ هەموویان رێکخست. ساڵێك زیاتربوو رۆژمان لە زیندانی ئەبوغرێبدا ئەژمارد و بەدەموچاوی تازە ئاشنابووین کە (کاظم خلف)ی گۆڵچی تۆپی پێم لە (ق ه)دا تووشی بوو پرسیارم لێکرد ئەی هاورێکانتان لە کوێن وتی: هەموو زیندوون لە (م)ولە (ق)ولە (م ) جەوری زیندان بەسەرئەبەن.

خانوەکانی تایبەتی ئەشکەنجەدان، چەند کۆلانێك دوربون لە شوێنی گرتوخانەی ئەمنەوە. ئەم بەرواڵەت ساختمانێکی چەند نهۆمی رێك‌و پێك بوو ئەوانیش لەناو ماڵاتدا هەریەکەو لە کۆلانێکدابوون بە گوێرەی بەشەکان‌و حزبەکانیان. گەرچی کەس لە ئێمە بەچاکی ئەو خانوانەی نەدیوە چونکە هەمیشە بەچاوی بەستراو نێچیری ئەشکەنجەو میوانی ئەو جەلادانەبووین. ژوورەکانی (ئینفرادی) لە چاو ئەو دۆزەخەی ئەشکەنجەدان تەلاری پشودان‌و لانەیەکی ئارامبون، کاتێ ئەشکەنجە دیارنەبوو هەندێجار لەگەڵ نانی بەیانیدا، یاکاتی قاوەڵتی هەندێ جاری تر لەگەڵ یەکەمین نانی ئێوارانندا ناویان ئەخوێندینەوە ئەو جارانەش کەشەو دەرەنگ بوایە

هەركـەس گـوێی لـەناوی خـۆی بوایـە سـامێکی زۆر جەستەی دائەگرت.

لەشـوێنی خۆمانـەوە بـە ئوتۆمبێـل ئـەیان بـردین بـۆ ئەشکەنجەدان ئـەو رۆژە کوتـەك لەسـەر هـاورێ ئەرسـەلان بایزبوو. لە جێگەیەك ئێمەیان بەپەنجەرەوە بەسـتەوەو نزیـك لە ئێمـە ئەشـکەنجەیان ئـەکرد تـا کـاری دەرونـی بکاتـە سەرمان بەدەنگی هەناسەو نەرمەکۆکەدا ئەمزانی کە خاڵە شیهاب لە تەنیشتمەوە هەڵواسراوە بەپەنجەرەیەکەوە قامچی ئەوان بەهەموو توانا شیریخەی لە ئەرسەلان ئەهێنا ئەوەدەمە لە هەمورمان کەم تەمەنتربوو هاواری بڵندی ئەکرد ئێـشی ئەگەیانە دڵمان.

کاکە شیهاب لەگەڵ ئەو بروسـکانە لـەم سـەرەتادا کـە رویـان تێئـەکردو بەتـەنها بـەدڵ پێمـان ئـەزانی زوو زوو ئامۆژگاری بڵاوئـەکردەوە هـیچ نیـە گـوێ مـەدەنێ خـۆی هاوارئەکات لەسەر ئەو بۆڵەبۆڵەی لای ئەوان مانای نـەبوو گەلێ ناخونەکی بۆکس‌و سەرەقامچی ئەخوارد تا ئەرسـەلان لەگەڵ یەك هاواری بڵندا لەناکاو کپ بـوو، دەنگـە دەنگـی ئەمنـەکان وای گەیانـد کـەوامزانی مـرد. کـە گەڕاینـەوە ئەرسەلان وتی ئاوات فێری کردم وابکەم، باشبوو ئیتر وازیان لێهێنام. لـەناو ئوتۆمبێلەکـەدا دەسـت بەکەلەپـچە خاڵـە

شیهاب کەفرسەتی هێنا بەم دەس‌و ئەودەستی دوانمانی گوشی وەك بیەوێت هەم پیرۆزبایمان لێبكات هەم هێزمان بداتێ لە شوێنەكەی خۆشمان بەرەوانی‌و بە گۆرانی بە هەموومانی وت هەركەسێ باری گران بوو بیخاتە ئەستۆی من.

دواین ساڵی خوێندنم بوو لە زانكۆ. لەبەغدا عەسرێك لای هەڤاڵ مام جەلال خاڵە شیهابم دی لەسەر كوردو بەیانی ئازارو حكومەتی بەعس قسەوباس گەرمبوو بەلای منەوە باسێكی تازەو لۆجیكی بوو. ئەوكاتەش هەڤاڵ مام جەلال لەهەر هێزی بەرەی نیشتمانی دەرسی پێئەوتین‌و لەو دەرسانەدا دەیان پرسیاری، چی بكەین، ئەوە روژە بەشوێن یەكێك لەو پرسیارانەدا شوێن خاڵە شیهاب كەوتم. چەندرۆژێك لەسەریەك خولیامان ئەنجامی ئەو باسانەبوو. بەرەحمەت بێ كاك (فازڵ مەلامەحمود) سێهەمی كۆڕەكەمان بوو كە جاروبار سەردانی هەڤاڵ مام جەلالمان ئەكردو پرسیاری ئایندەی كوردو رژێمی بەعسمان لێ ئەكرد. ئەمانویست ئەوەندەی ئەكرێ بتوانین ئاسۆی مەسەلەكەمان باشتربببینین وەرامەكانی مام جەلالیش هاندان بوو بەرەو بیری نوێ. یەكێ لە رۆژانی سەرەتای مایس ١٩٧٠ لە

وەزارەتی بلدیات کارمەندبووم کاك (فـازڵ) میوانمبـوو کـە خاڵەشیهاب سەردانی کردم لە ژورەکەمدا درێژەی قسەکانی رۆژی رابردوو دامەزرایەوەو هەرلەوێ خاڵـە شـیهاب وتـی: ئەبێ رێکخراوێکی سیاسی نوێ دابمەزرێنین رێکخراوی بیری نـوێی رەنجـدەران بـێو بـە بیروبـاوەری ماوتـسی تـونگ بەمارکسیزم- لینینیزم رێنوێنی خۆی بکـات بڕیارمانـدا بچین لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال قسە بکەین هەرئـەورۆژە گرێی رازەکانمان بـۆ کـاك (دلێـر سـدیق)ی ئەنـدازیار کردەوە لەگەڵمان هات. پاش باسکردنی نیازەکەمان بـۆ مـام جـەلالو رەزامەنـدی ئـەویش لەسـەربیری ئـەوکارە شۆڕشگێڕیە ئامۆژگـاری کـردین کـە لەگـەڵ هـەموو برایانی تر قسەبکەین ئەوسا کۆبونەوەیەك بکـەین بـۆ: دانــانی بەرنامەیــەکی رۆشــن بــۆ خـــەباتو رێبــازی رێکخراوەکە.

-پەیڕەوەی ناخۆ

-نەخشەی کـارکردن لەو هەلومەرجە ناسكو دژوارەدا.

-دیاریکردنی سەرکردایەتی رێکخراوەکە.

-ئەودەمە شەپۆلێکی فراوانی چەپخوازی لە کوردستاندا پەرەی سەندبو دەستەیەك لەوانە لەدەوری مام جەلال بـوون.

دەستەیەکی تر لـەدەوری گۆڤـاری رزگـاری لـەدەوری کـاک نەوشیروان بوون. دەستەی خوێنـدکارانی زانکـۆش هـەبوون دەستکرا بەپەیوەندیو بیرگۆڕینەوە. کاك فازڵ بیروڕای مـام جەلالو ئێمەی بۆ کاك نەوشیروان برد، بەڵام بەداخـەوە هـەم ئەو وەرامەکەی واهێنایەوە کە کاك نەوشیروان لـە دەستـەی دامەزرێنـەرو سـەرکردایەتیەکەیدا بەشـداری ناکـا، بـەڵام هاوڕێکانی هانبدات کـە بەشـدارو هاوکـاری بکـەن. هـەم بـەهۆی ئـەوەی کـە فـەرمانی گرتنـی دەرچـووبوو خـۆی شاردبووەوە بەشداری کاك نەوشـیروان وەك چـاوەڕوان ئـەکرا سەری نەگرت. خاڵەشیهاب و من لەگەڵ ئەوانەدا کـە مـام جەلال قسەی لەگەڵ کردبوون قسەمان تـەواوکرد هاوڕێیـان (فوئـاد قـەرەداغیو رەفعـەتی مـەلا) ئێمـەش لەگـەڵ خوێندکاران هاوڕێیـان شاسـوار جـەلال (ئـارام) جەعفـەر عەبدولواحید، دارۆشـێخ نـوری، مامۆسـتا عزیـز، سـالار عـەزیز، محەمـەد قـەرەداغی، نـەرمین عوسمـان، پرشـنگ محەمەد، شێخ محەمەدی چینی قسەمان کردبـوو بەیـەك لـە سلێمانیش هاوڕێیان ئـاوات عەبدولغـەفور، فـەوزی مـەلا مەحمود، عومەر سەید عەلی مامۆستا جەمال تاهیر، دلێـر تاهر) قسەمان کردبوو بەیەكو هەریەکەش لـەو هاوڕیانـە

لەگــەڵ ژمارەیــەك قــسەی کردبــوو پــاش زنجیرەیــەك چاوپێکەوتنی بەردەوامی نێوانمان لـە ڕۆژی ١٩٧٠/٦/١٠ لەماڵی خاڵە شیهاب لە بەغدا یەکەمین کۆبونەوەمان کـرد بە ئامادەبوونی هاوڕێیان (مام جەلال، خاڵەشیهاب، فوئـاد قەرەداغی، دلێر سدیق لەو کۆبونەوەیەدا.

-هێڵە گشتیەکانی بەرنامە دارێژرا.

-خاڵەکانی ئامۆژگاری کارکردن دیاریکران زۆربەی مـام جەلال‌و باقی کاك فوئادو من دامانڕشتەوە.

لەیەکـەمین کۆبونـەوە هـەڤاڵ مـام جـەلال بەگـشتی دەنگ بەسـکرتێری کۆمەڵـە هەڵبـژێررا ئـەویش خـۆی بۆتەرخانکرد، گەلێ چەك‌و توانـای خـستەبەر دەسـتمان، تاهەندێکی بۆ ڕۆژی خۆی هـەڵگیریێ‌و ڕێکخراوەکانیـشی پێ‌چەکدار بکـرێ. لـە خانووەکـانی (عرصـات هندیـە) لەکەڕادە خانویەکی بۆگرتین بۆ کۆبونەوەو کـاری نهێنـی زۆربەی کات هاوڕێیـان (فـازل مـەلا مـەحمود)و(دلێـر سدیق) لەوێ بوون ڕۆژێکی هـەینی لـە کۆتـایی سـاڵی ١٩٧٠دا کۆبونەوەیــەکمان بەســت بــۆ لێکۆڵینــەوەی ئامــانج‌و ماهیــەتی کۆمەڵــە. لەئەنجامــدا دەرکــەوت دووجۆر بیرکردنەوە لەناوماندا هەیە:

١- هاوڕێ فازڵو چەند کەسێکی کۆمیتەی سلێمانی بیرکردنەوەیەکی عیراقچیان هەبوو.

٢-بەسەرکردایەتی هەڤاڵ مام جەلال، خاڵە شیهابو هەموو ئێمە بیرکردنەوەیەکی کوردستانیمان هەبوو.

هەڤاڵ مام جەلال لەسەر زووساغکردنەوەی ئەم مەسەلە بنەڕەتیە بە ئوسلوبێکی دیموکراتی سووربوو بۆیە داوامان کرد هەمووئەندامان بەنامە بیروڕایان لەسەر ئەم مەسەلەیە بۆ کۆمیتەکانیان بنووسن، ئەوانیش سەرکردایەتی ئاگاداربکەنەوە. لەئەنجامدا کاک فازڵو ١٢کەس لە کۆمەڵە چوونەدەرەوە، بەداخەوە لەگێژەنگی ئەو مەسەلەیەدا هاوڕێ فوئاد قەرەداخی کشایەوەو لەوساکەوە دورکەوتەوە.

هەڤاڵ مام جەلال سوربوو لەسەر پەروەردەکردنی هەمومان بەبیروڕاو زانیاری بەردەوام پرۆسەی فێرکردنو پەروەدەکردنی درێژەی هەبوو تەنانەت شانەکان ناونرابوون شانەی روناکبیری بۆقۆناغی ئامادەکردنو پێگەیاندن.

خاڵەشیهاب رۆڵێکی گرنگی لەو پرۆسەیەدا هەبوو شەوان هەفتەی دووجار کۆڕێکی فروانمان لە کەرکوک بۆئەو مەبەستە هەبوو کە شەهید ئازاد هەورامیو پاشان شەهید

ئـــەنوەر حەســـەن‌و گـــەلێجار شـــەهید جەعفـــەر لـــە ئامادەبووەکـــانی ئـــەبوون بەتایبـــەتی ئـــەو ماوەیـــە کـــە خالەشیهاب دەستی لە کار هەلگرتبوو، بەتەنها بۆ کۆمەلە کاری ئەکرد، بەدزیەوە خەریکی کارکردن بوو بـۆ کۆمەلـە لە مالی هاورێیان (ئیبراهیم جـەلال‌و فەیـسەل تالـەبانی‌و حەمەکەریم کرێکار و لای بەندە ئەژیا. زۆربـەی ژیـانی بـۆ ئەوکۆبونەوانە تـەرخانکردبوو. لـەوبوارەدا دەورێکـی گـەلێ دیاری هەبوو.

هێشتا کۆمـەلە ساوابوو. رێکخراوەکـانی لـە سـلێمانی‌و هەولێرو بەغـداو دهـۆك‌و خانـەقین‌و کـەرکوك. خـورت و بەتەجروبەنـەبوون، بەباشـی بەهەموولایەکـدا پـەل‌وپۆیان نەهاویشتبوو خالە شیهاب وتـی: هـەڤالْ مـام جـەلال وای لاچاکە سـەردانێکی بکـەم بـۆ دیمەشـق لـەوێ لەنزیکـەوە لەسەر مەسەلەکانی گۆڕەپـانی ئێـرەو مەسـەلە تازەکـانی ناوچەکە قسەوباسی لەگەلْ بکەم.

-بەلێ باشە ماوەیەکی زۆرە هەڤالْ مام جەلال دورەلێمان تـەنها هـۆی مـشت‌ومڕو بیروڕاگۆڕینـەوەمان نامەیـە.... ماوەیەك ئەمێنمەوە. باشتروایە، لە لوبنان دۆسـتمان هەیـە لـەناو فەلەستینەکانیـشدا تـۆش بیانبینیـت چـاکە. لـەو

سەفەرەدا خاڵە شیهاب باشترو نزیك تر تەماشای ئەو شەپۆلەی چەپی کردبوو کە لەوێوە بۆلای ئێمەئەهات لەسەرگەلێ مەسەلەی گرنگ بەتێرو تەسەلی لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال قسەوباسیکردبوو- بەلاّم بەداخەوە هەندێ لەسەرکردەکانی رێکخراوێکی چەپی عیراقی ناسیبوویان لەوێ چاویان پێییکەوتبوو. قسەیان لەگەڵ کردبوو (کاتی گرتن ئەو دیدارەی ئەوانە کوشندەبوو).

بەهاری ساڵی ١٩٧٣ رۆژێکی سەرقاڵی کاکە جەعفەر خۆی بەماڵداکردو وتی: مژدەمبەرێ خاڵە شیهاب گەڕاوەتەوە. کەیوچۆن؟ دوورۆژە. لە رێگەی زاخۆ-موسڵەوە هاتۆتەوە، بە پەنهانی هاتۆتەوە باکەس نەزانێ چونکە بڕیاری وایە ئیتر بە پەنهانی کاربکاتو بەتەنها بۆ کۆمەڵەبژی هەربۆ ئەویش کاربکات.

لەوکاتەوە کەهات بۆ کەرکوكو لەوێ جێگەی خۆشکرد. لەسەرەداتا لە ماڵی هاورێ (ئیبراهیم جەلال) ناوبەناویش لەلای ئەبوشیهابو زۆربەی کاتیش لە ماڵی من بوو ئیتر بەڕاستیو بەجەختو هیمەتێکی زۆر شەورۆژ کەوتەکار بۆکۆمەڵە.

هەفتەیەك لە سلێمانی لەنزیكەوە كێشە ڕێكخراوەییەكانی چارەسەرئەكرد، مانگێ لەكەركوك دەورەی خەستی بۆ كادران ئەكردەوە یەك دوو‌هەفتەش كۆمیتەی هەولێری بەسەرئەكردەوە. خاڵەشیهاب بوو بە خاڵەعوسمانو لەگەڵ كرێكار كرێكاری ئەكردو شانە، شانەش ئەگەڕا وەكو هەنگ شانەی بیرو زانستی بینائەكرد. بەوجۆرە مایەوە جارجارەش بەدزیەوە هاوسەرو منداڵەكانی ئەبینی، ئەوەندەی بە كۆمەڵەوە مەشغوڵ بوو زۆر لەوەكەمتر دڵی بەژنو منداڵەكانی دابوو، تا ئەوكاتەی بەهار هاتو ڕژێمی بەعس لە بەڵێنەكانی ئازار پەشیمان بوەوە. خاڵە شیهاب وتی: كۆمەڵە لەسەر بنچینەی ئەم ڕاستیانە دامەزراوە كە ئەم ڕژێمانە ناتوانن كێشەی گەلان چارەسەبكەن بۆیە ئەبێ ئێمە لەتەك گەلەكەماندا، لەگەڵ شۆڕشەكەی بین، كۆبوینەوە، بڕیارماندا كە ئێمە زۆربەمان بچینە ناو هێزی پێشمەرگەوە، بەڵام خاڵە شیهاب لەگەڵ كاكە جەعفەر، ئەنوەر زۆراب، كۆمیتەیەك بۆ ڕێكخستنی شارەكان لەگەڵ هاوڕێیان ئاسۆ شێخ نوری، ئیبراهیم جەلال پێكبهێنن. ئێمە چوینە دەرەوە، دوومانگی نەبرد دوور لە

پێشمەرگە خۆی نەگرت (خاڵە شیهاب) هاتە دەرەوە پێکەوە لەوێ خەریکی شۆڕش‌و کۆمەڵە بووین.

رووناکی چرای ژوورەکەی هاوڕێ (ئارام) دەرەقەتی تاریکایی ئەو شەوەی دەربەند نەئەهات پانتایی نێوان خاڵە شیهاب‌و هاوڕێیان شاسوراو دارۆو لیدیاو من تا ئەندازەیەك روناك بوو. ئەو رستانە بەدی ئەکرا خاڵەشیهاب لەسەر لاپەڕەی دەفتەرەکەی بەردەمی ئەی نوسیوە، بەڵام گۆشەکانی ژوورەکەو هاتوچۆی هاوڕێ دارۆ بو ڕاڕەوەکە بەچاکی نەئەبینرا خاڵە شیهاب وتی: لە کاك ئیدریس واحاڵی بووین کە هیچ ئومێدی نەماوە. کاك (نوری)یش ئەوەی سەلماند کە کەسیان نیازی بەرگریان نیە بەراستی بڵاوەی لێوەکەن؟ بڕواناکەم!! بەڵێ دوابڕیار ئەوەیە بڵاوەی لێبکەن لیدیا هەڵی دایەو وتی ئەگەر ئێوە بڕیاری خۆتان جێبەجێ بکەن، ئەوانیش ناچارئەبن هەڵوێست بگرن... توخوا وانیە؟

بەڵێ بڕیاری ئێمە ئەوەیە بەرگری رێکخەین.. ئەمڕۆ هاوڕێیان هەموو بڕیاری بەرگریاندا.. کۆمەڵە لە بەرگریدا گەورەتر ئەبێ هاوڕێ ئارام رووی کردە خاڵە شیهاب پرسی! کاك عەلی عەسکەری ئەڵێ چی؟ ئەڵێ ئامادەم بۆ بەرگری.. حەیفە ئەم شۆڕشە بڵاوەی پێبکرێ لیدیا دەستی برد بۆ

کیسه خەوەکەی وتی: شتەکانم باری ولاخێکە هەرچی پێویست بێ ئامادەی ئەکەم. ئەتوانم گوێدرێژکی بۆ پەیدابکەم هاورێ ئارام پێی وت! کەر یا ئەوەی تر؟

(ئەوان چی لەم هەموو چەکە قورسە ئەکەن). لەولاوە ئەم رستەیەی هاورێ دارۆ وەك سی خورمە خۆی کرد بەباسەکەدا بەتەمای هیچ نەبن هەرچی دەستئەکەوێ بیشارنەوە (کلاشنیکۆف، برنەو هاوەن) هەرچی کادرو سەرکردایەتی کۆمەڵە هەیە بە گوێرەی بریارەکە هاتبوونە پێنجوێن- کۆبونەوەی کۆمیتەکان لە پێنجوێن لە ماڵی کاکە حەمەی میرزا سەعید ئەبەستران راگیری لەسەر ئەوەکرا کە بەرگری بکرێت یان نا... کۆبونەوەی سەرەکی لە گوندی کێلوبوو لەماڵی هاورێ ئاوات عەبدولغەفور نامەیەکی هەڤاڵ مام جەلال-یش هاتبوو کە داوای خۆسازدانی ئەکرد بۆ بەرگری، خاڵە شیهاب‌و هاورێیان عەلی بچکۆل، عومەرسەیدعەلی، ئاوات عەبدلغەفور، حەمەی میرزا سەعید شەهید عەبدولرەزاق‌و من ئامادەی کۆبوونەوەکەبووین هەر لەو رۆژەدا هاورێیان ئەرسەلان بایزو ئەنوەر شاکەلی، حەمیدەسوور، عەلی مغاویر کەمال عەلی، وەستا کەمال، ئازادهەورامی. سادق مامۆستا ئەمین،

شەهیدان سیروان بێستون لە دیدارەکانی راوێژدا ئامادەبوون خاڵە شیهاب بەدرێژای ئەو رۆژە لەگەڵ شەهیدان فەتاح ئاغاو نوری حەمەعەلی خەریك بوو لەبەرگریدا بەشداری بکەن، هەرنەبێ هەندێ چەكو تەقەمەنی بدەن بەو لاوانەی ئەمێننەوە.. لەسەرەتادا رازی بوونو عەسرگەڕانەوە. هاوڕێکانمان ئامادەبوون بۆ بەرگری، خاڵە شیهاب سووربوو لەسەربەرگری. هەرەسەکە داروخانێکی گەورەبوو دارڕوخانی ئیرادەبوو ئیرادەی بەردەوام بوونو گیانبازی لای سەرکردایەتی پارتی نەمابوو، ئێران گوشاری زۆربوو. بارزانی لای وابوو هیچ جۆرە بەرگریەك ناکرێو رێگەی نابێ هەموو فەرماندەکانیش کەوتبوونە بەرلێشاوی هەرەسەکە. پێشمەرگەو خەڵکی روو لەچارەنووسی نادیار سەرگەردان بوون، خاڵە شیهاب ئەیووت بەرگری. بەڵام کۆبونەوەکەی گەیشتە ئەم ئەنجامە.

-ئێستا دەموودەس بەرگری چەکدارناکرێ.

-لەئێستەوە ئەبێ خۆ بۆبەرگری ئامادەبکەین، چەك، تەقەمەنی، چاپەمەنی بشارینەوە بوار نەدەین تێکۆشەرەکانی کۆمەڵە رووبکەنە هەندەران، رێکخستن کۆکبکەینەوە پاش نیشتنەوەی تەوژمی ئەو هەرەسەیە

نەخشەیەکی ڕێکوپێك ڕووبکەینەوە شاخ. بەڵام تەنها چەند مانگێ دوای ئەو کۆبونەوەیە، لە کۆبونەوەیەکی تری سەرکردایەتی کۆمەڵەدا لە شاری سلێمانی، جارێکی تر خاڵە شیهاب پێشنیاری بەرگریکردنی بزواندەوە، دەست بەپرس و ڕاوێژکراو من هەڵگری ئەو پێشنیارە بووم بۆ لای هەڤاڵ مام جەلال لە کۆتایی گەلاوێژو سەرەتای ئابی ١٩٧٥دا بۆهەندەران.

کوردستان بووبوو بەزیندانی جەنگاوەرێکی شکاو

حکومەتی بەغدا ئەگەرچی لە ڕێکەوتنی ٧٥ی جەزائیردا، گەڵی خاك و شوێنی گرنگی عیراقی دۆڕاند، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر تەختی ڕەگەز پەرستی. سەرمەستی سەرکەوتن بو بەسەر جوڵانەوەی کورددا.

کوردایەتی قاچاخ بو، ئەوی کورد پەروەرەو لای بەعسیان ئاشکرابو هەموو لە کوردستان دوورخرابونەوە. تۆڕی جاسوسی تا ئەهات وەك هەریز ئەتەنیەوە. لە کۆبونەوەی گەلاوێژی ١٩٧٥دا لە سلێمانی خاڵەشیهاب بە سەرکردایەتی کۆمەڵەی ووت: ئیتر کاتی هەڵسانەوەیە، ئەبێ شۆڕش بەرپا بکرێتەوە.

چۆن- دەست پێبکەین.- سەرەتا دەستەی چەکدار، با دەست بەجەولە بکەن، گوندەکان بگەڕێن، قسە بۆ خەڵکی بکەن، بۆ روناکردنەوەی ئەم تاریکستانە بچنە دەرەوە، نەك بۆ شەڕ. بۆچی تا زەمینە ئامادەبکەن ئومێد لای خەڵکی زیندوبێتەوە. خەڵکی بۆ پێشمەرگایەتی ئامادەبن ئەوسا چالاکی چەکدارانەش ئەنجام بدەن. ئەبێ داگیرکەر لەوەبگات گیانی بزێوی کوردی پێ دەستەمۆ ناکرێ. هاوڕێ عەلی بچکۆل وتی: ئامادەم یەکەمین دەستەبم. جارێ یەکەمین هەنگاو ئەبێ فەرەیدون بگاتە لای هەڤاڵ مام جەلال پێشنیاری دروستکردنەوەی دەستە چەکدارەکانی بۆ بەرێ.

-ئامادەم تەگبیری سەفەرەکەم ئەکەم; پێی بڵێ خۆت چەند جارێکە داوا ئەکەی دەست بەکاربین ئێستا ئەتوانین لە مرۆوە خەریکی ئەوەبین هاوڕێیانی کەرکوك چەند مەفرەزەیەك ئامادەبکەن بۆ ناوچەی سورقاوشانو چەمی رێزان. مام نەریمانی (کەڵەشێرە) بنکەیەکی باشە.

-بۆی باس بکە چەند دەستەیەك بۆ هەڵەتەکانی گەرمیان ئەنێرین لە هاوڕێیانی هەڵەبجە چەند دەستەیەك بۆ هەورامانو شارەزوور. قسەم لەگەڵ کاك تایەر عەلی والی بەگ کردوە بۆ ناوچەی شەمێران، کاك جەعفەر قسەی

لەگەڵ عەلی سالحو برادەرەکەی باڵەك کردوە.. ئامادەیی هەیە.

پاش ٩ رۆژ سەفەرم کرد.

بەدەم دەیان خەوی ئازادی رەنگاو رەنگەوە گەیشتمە شام کەچی مام جەلال سەفەری کردبو عبدللە نصراوی پێوتم بەکارێکی گرنگ سەفەری کردوە. پاشان تێگەیشتم لە هاوکاریەکی گرنگی بزوتنەوەی رزگاریخوازی فەلەستیندا سەرقاڵەو جێگەی نادیارە.

عبدللە وتی: تا یەك مانگی تر پەیدانابێ.

-باشە پاسپۆرتێکم بۆ پەیدابکە لێرە نابم ئەچم خۆم بزرئەکەم رۆژی ئایندە پاسپۆرتم ئامادەبو بێ گیروگرفت چوم بۆ ئەستەمۆل لەوێ مامەوە تا بە تەلەفۆن هەواڵم زانی کاتی ئەوە هاتوە بچم بۆ بەرلین، لەوێ مام جەلال ببینم.

لەوێ لە ئەستەمۆل لەسەر شەقامێکی شار توشی (عبدالوهاب قرەغولی) بوم لێپرسراوێکی گەورەی بەعسی بو کاتی کارکردنم لە وەزارەتی شارەوانی لەگەڵی ئاشنابوم لەسەرەتادا زۆر ترسام، بەڵام کاتی گرتنم بەفریام کەوتو بۆم بوبە شاهید کە لە سوریا نەبوم بەڵکە لە تورکیا بوم

(چونکە سوریا مانای پەیوەندی بو بە مام جەلال‌و ئۆپۆزیسیون‌و دەوڵەتێکی دوژمنی رژێمی عیراق.

ئەو باخچە گشتیە لە جەرگەی شاری برلین دا بولە سەگ‌و پیرەژن بەو لاوە کەسی تری لێنەبو ئێمەش لەبەر قسەکانی خۆمان بەچاکی دیمەنە جوانەکانی گوڵ‌و گەڵای بێ‌ئەندازە جوان‌و رێکوپێکی ئەو باغچە جوانەمان نەدیبوو هەڤاڵ مام جەلال بەپەلە هەنگاوەکانی ئەنا بەپەرۆشبو بۆ بیستنی هەواڵەکانی هاورێیان لەو ماوەیەدا توانای کار گیروگرفتەکانی خۆمانم هەمو بۆباسکرد. بەدەم زیاتر لەیەك سەعات‌و نیو پیاسەی بەردەوامەوە، راو ئامۆژگاریەکانی خۆی بۆ شیکردمەوە. زۆرباشە کاتێکی لەبارە دەست بەکارین. بەدوورو درێژی رێ‌و شوێنەکانی بۆ باسکردم پاشان وتی: (پەیام بگەیەنن بە کاك عەلی عەسکەری‌و دکتۆر خالید.. لەگەڵ کاك عومەریش قسەبکەن. با سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانیی لە ناوەوەی وڵات دەست بەکارین بەناوی یەکێتییەوە کاربکەن زۆررترین‌و فراوانترین بەشی کۆمەڵانی خەڵکی لە دەوری کۆبکەنەوە.

-ئەی کۆمەڵە.

-کۆمەڵە با داینەمۆبێت، بەڵام ئاشکرای مەکەن هەر بەناوی یەکێتییەوە کارە ئاشکراکان ئەنجام بدەن زۆر چاکتان کردوە بۆ کاک تایەر.. خۆشم لە بیرمە زۆر نابات کاری لای ئێمە ئامادەئەبێ ئومێدم وایە زوو یەك بگرینەوە.

-ئەی هاوڕێیان.

باشە خاڵە شیهابو ئاوات بنێرن گەلێ شتیان فێربکەین.

قسەوباس لە کۆتایی دابو ووتم: ئەرێ مام جەلال لەم شارە خۆشەدا هەر ئەم باخچەیە هەیە. وتی: باشە بۆ شوێنی خۆشتریشت ئەبەم لە قاوەخانەیەکی خۆش لەوە ووریای کردمەوە کە ئەندامێکی گرنگی (الحرکە الاشتراکیە العربیە) گیراوە... هۆشیاری خۆتان بن.

بەقورسایی ئەرکی زۆرو جیاجیا. بەڵام بەدەم هیوایەکی گەشەوە گەڕامەوە تا بگەمەوە لای هاوڕێکانمو دەنگ‌وباس‌و بیروڕاکانیان پێرابگەیەنم. یەکەمین ئێستگەم شاری (رمادی)بوو لەوێ فەرمانبەربووم لە شارەوانی هاوکارێکم پێی وتم: چەند ئەمنێك هاتبوونە سۆراخی تۆ ئیتر نەوەستام بە ووریایی تەواو چووم پرسیار لە هاوڕێ ئەنوەر زۆراب بکەم لە دراوسێکەیان حاڵی بووم کە گیراوە سامێکی گەورە پەڵەهەورێکی رەشی ئاراستەی هیواو خەیاڵە خۆشەکانم

کرد. بەدڵەڕاوکێو چەندین پرسیاری بێ وەرامەوە هەر ئـەو ڕۆژە خۆم گەیاندە سلێمانی.

حاڵـەتی ئامادەباشـم لـە خڕبوونـەوەی خاڵـە شـیهابو هاوڕێیان عومەری سەید عەلیو عەلی بچکۆل دا بەدی کرد خاڵە شیهاب وتی:

-وەزعی ئێمە باش نیە هەندێ لـە هاوڕێیانمـان گـیراون، گوێ مەدەرێ تـەگبیری لێ ئەکـەین گـرنگ دەنگوبـاس لای تۆیە.

بەوردی دوورودرێژی قسەکانم بۆکردن ئەوانیش دڵخۆشـتر کەوتنە گفتوگۆ بـۆم دەرکـەوت کـە سـەرەتای سـەفەرەکەم خزمێکی هاوڕێ ئاسۆی شێخ نوری. خۆیو چەند هاوڕێیەکی شاری سـلێمانی گـیراون لـە بەغـدا کاکـە حەمـەی مـیرزا سەعید گیراوە، پاش دەسگیرکردنی سەرکردەکانی بزوتنەوەی سۆسیالیستی عـەرەب هـاوڕێ ئـەنوەر زۆراب گـیراوە پـاش چەند ڕۆژ لە گرتنی ئەو دوو هاوڕێیە گرتن لە ڕیزەکانمانـدا دەستی پێکردووە دوو هاوڕێی تـر سـەلامو حـاکم ئیـبراهیم گیراون ٣ کەسی تر ناچاربوون خۆیان بشارنەوە خاڵە شیهاب وتی:

-دوو ئەنــدامی ســەرکردایەتی‌و دوو کادرمــان گـیراون..
دیارە لەوانە یەکێك یــا زیــاتر نهێنیــەکانیان درکانــدووە...
لەوانەیە دۆستە عەرەبەکەی قسەی کردبێ..
ئەبێ قسەکردنی ئێمەشی گرتبێتەوە؟
-گرتنی کتوپڕی ئەنوەر گومان ئەخاتە سەر ئەویش‌و کاکە حەمەش.
-ڕۆژی دوایی تر هاوڕێ عەلی بچکۆل هەواڵی کەســوکاری هاوڕێ (ئەنوەر)ی بۆ هاتبوو بــەپێی ئــەو هەواڵانــە گومــانی خاڵە شیهاب لــە جێگــەی خۆیــدابوو شــەهید ئــەنوەر نــاوی هاتبوو گوایە بڕیاربووە یەکەمین پێنجشەممەی ئەیلولی ١٩٧٥ هاوڕێیان لە ماڵی ئەوان کۆبوونەوەبکــەن ئــەویش دڵــی لای هاوڕێکــانی بــووە هــەوڵی داوە بەهــەرنرخێ بــێ هۆشــیاریان بکاتەوە بۆیە بە ئەمنــەکان ئــەڵێ لــە ماڵــەوە شــتی هەیــە تەسلیمی ئەکات، لە چوونە ماڵ‌و پشکنیندا فرسەت ئەهێنێ لە باوەشی هاوسەرەکەیدا منداڵەکەی ماچ ئەکاو پێــی ئــەڵێ فریاکەوە کەس نەیەت بۆ ئێرە ئەویش بەپەلە هەواڵ بۆ مــاڵی خۆیان لە کەرکوك ئەنێرێ‌و ئەوانیش هــاوڕێ عــەلی بــچکۆل ئاگادار ئەکەن. خاڵە شیهاب رووی تێکردین وتی:

-ئەبێ کۆمەڵە رزگاربکەین نەخرێتەوە بەر زەبری ئەگەری سەخت هەرچی سەرکردایەتی هەیە هەرچی ئەو کادرانەی گیراوان نەیانناسن، خۆیان بشارنەوە.

هەر ئەو ئێوارە حاکم (ف) لە سلێمانی ئاگاداری کردین کە بڕیاری گرتنی (خاڵە شیهاب، هاوڕێیان جەعفەر، عەلی بچکۆل، عومەر سەید عەلی، فەرەیدون) لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەرچووە. ئیتر هەموو خۆمان شاردەوە ئەو ماوەیە لە ماڵی خاڵم بووین (وەستا بەکری دارتاش) لە وێوە خەریکی پەیوەندی بووین.

لیژنەیەکی سەرپەرشتیمان لە هاوڕێیان (ئازاد هەورامی، ئەرسەلان بایز، عوسمان و هاوڕێیەکی بەغداو راوێژکاری ئەبو شیهاب) دروستکرد.

لەرێگەی خزمانی سلێمانیەوە جوابمان بۆ شەهید عەلی عەسکەری نارد بەپەلە هاوڕێ (عەلی مستەفا) بەدوای جەعفەردا رەوانەکرا.

کە هەم بۆ راسپاردەکانی هەڤاڵ مام جەلال پەیوەندی لەگەڵ شەهید دکتۆر خالید بکات هەم خۆی بگەیێنێتە لامان.

هەموو لە حەشارگەی خۆمان لە سلێمانی کۆبووین خالـە ئیهاب رووی تێکردین وتی:

-واچاکە ئێوەش لەگەڵ من بـن تـەگبیر لـەهاتنی هـاورێ ئاوات بکەن.

لەسەر قسەی مام جەلال ئەبێ منو ئـاوات بـچین کەواتـە ئێوەش وەرن با رێکخستن سەلامەت بێ پاشـان لـەوێوە پـاش تەگبیری تەواو هەموو پێکەوە ئەدەینەوە شاخ. مـشتومڕ زۆری خایاند لـە ئانجامـدا پێکـەوە رووومـانکردە شـارباژێڕ تـا لـە ئێرانەوە پەیوەندی لەگەڵ سەفیری سوریا بکەین بۆ گەیشتن بە هەڤاڵ مام جەلال.

**سەرنج:**

شیهاب: هەڤاڵ مام جەلال بۆی راستکردمەوە کە شیهاب راستە مانای کشانی نورە، شەهاب هەڵەیە ماناکەی خۆشنیە.

